چیرۆكی پێغەمبەران

# چیرۆكی حەزرەتی موسا
## (سڵاوی خوای لێبێت)

6

نووسەر : كەمال سەید
وەرگێڕانی : ئازاد عەبباس گڵێجاڵی




وێنە : حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: چیرۆکی حەزرەتی موسا(سلاوی خوای لێبێت)
ناوی نووسەر: کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا
نۆبەتی چاپ: دووەم/2022
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: 1000 دانە
ژپنک (ISBN): 978-9922-626-65-9
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1332)ـی ساڵی (2018)ـی پێ دراوە.





**ناوەندی ڕێنوێن**

 07701932749 - 07501269689

 hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

 سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی موسا

## (سڵاوی خوای لێبێت)


نووسەر : کەمال سەید

وەرگێرانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی

وێنە: حەسەنێین و تەییە عەبدوڵڵا


6

## حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)

نەوەکانی حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) لە میسر دەژیان.. لە مێژووودا بە (نەوەکانی ئیسرائیل) ناسراون.. دوای تێپەڕینی دەیان ساڵ، نەوەکانی حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) بوون بە گەلێکی زۆر..

خەڵکی چاکەی حەزرەتی یوسفیان(سڵاوی خوای لێبێت) لە بیر چوویەوە.. فیرعەونەکانی میسر ستەمیان لە نەوەی ئیسرائیل دەکرد..

نەوەی ئیسرائیلیش پشت بە پشت مزگێنی ڕزگاربوونیان لە دەست فیرعەون پێدرابوو..

کاهینەکانیش بە فیرعەونیان گوتبوو: لە ناو نەوەکانی ئیسرائیلدا کوڕێک دێتە دونیا، ئەو کوڕە حکومەتەکەی تۆ دەڕووخێنێت!..

## ڕووباری نیل

ویستی خوای گەورە وابوو موسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە دایک ببێت.. ئەو مامانەی بە دیار دایکی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)وە دانیشتبوو، لە دڵەوە موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی تازە لە دایک بووی خۆش ویست.. بۆیە دڵنیایی دا بە دایکی حەزرەتی موسا و پێی وت: بێخەم بە من لای هیچ کەسێک ناڵێم کوڕیان بووە.. ناهێڵم شۆفارەکانی فیرعەون پێتان بزانن..

شۆفارەکانی فیرعەون کۆڵان بە کۆڵان بە دوای کوڕی تازە لە دایکبوودا دەگەڕان.. بە هەر کوڕێکی تازە لە دایکبوویان بزانیایە دەیانبرد و دەیانکوشت..

دایکی حەزرەتی موسا ترسی لێ نیشت.. خوای گەورە خستیە دڵیەوە کە موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بخاتە نێو سندووقێکی تەختە و بیخانە نێو ڕووباری نیلەوە..

دایکی موسا، موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی تازە لە دایکبووی خستە ناو سندووقێکەوە و جوان کونبڕی کرد و فڕێی دایە نێو ڕووباری نیلەوە.. شەپۆلی ڕووبارەکە سندووقەکەیان برد..

دایکی موسا بە کچێکی خۆی گوت:

ڕۆڵە لە دوورەوە چاودێری سندووقەکە بکە، بزانە ئاو بۆ کوێی دەبات؟!..

## کۆشکی فیرعەون

شەپۆلی ئاو سندووقەکەی لای کۆشکی فیرعەون لادا.. خاتوو ئاسیەی ژنی فیرعەون گوێی لە دەنگی منداڵێکی ساوا بوو، کە لە نێو سندووقەکەوە دەهاتە دەرەوە..

خاتوو ئاسیە بە پاسەوانێکی وت: ئەو سندووقەم بۆ بێنە!..

دوای ئەوەی سەری سندووقەکەی لادا، بینی کوڕێکی تازە لە دایکبووی زۆر شیرین و جوانی تێدایە..

فیرعەون چاوی بە کوڕە بچکۆلانەکە کەوت و دڵی پڕبوو لە ڕق و کینە بۆی.. بە پاسەوانەکانی وت: سەری لە لاشەی جیا بکەنەوە و بیکوژن!..

بەڵام خاتوو ئاسیە نەیهێشت و وتی: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَ لَكَ لاتَقْتُلُوهُ عَسى أَنْ يَنْفَعَنا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَداً﴾ القصص: ٩ واتە: هیوادارم ببێتە مایەی خۆشحاڵی و چاوڕوونی بۆ منیش و بۆ تۆیش، مەیکوژن، بەڵکو لە ئایندەدا سوودمان پێ بگەیەنێت، یان دەیکەینە کوڕی خۆمان.

منداڵەکە دەرگیا.. خاتوو ئاسیە منداڵەکەی لە باوەش گرت..

خاتوو ئاسیە بانگی دەیان ژنی شیردەری کرد، بۆ ئەوەی مەمکی خۆیان بە موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بدەن و تێری بکەن، بەڵام موسا(سڵاوی خوای لێبێت) شیری هیچیانی نەخوارد..

## گەڕانەوە بۆ باوەشی دایک

خوشکەکەی موسا هات و ئەو دیمەنەی بینی کە موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی برای مەمکی هیچ یەک لەو ژنانە ناگرێ و لە تاو برسێتیش هەر دەگری!.. بۆیە وتی: ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَ هُمْ لَهُ ناصِحُونَ﴾ القصص: ١٢ واتە: ئایا ناونیشانیماڵێکتان پێ بڵێم کە ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکەن، دڵسۆز و میهرەبانیش بن بۆی؟.

کیژەکە گەڕایەوە بۆ لای دایکی و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.. دایکی زۆر بە پەلە بەرەو کۆشک کەوتەڕێ، بەڵام وای پیشاندا کە ئەم منداڵە ناناسێت و هەرگیز نەیدیوە..

بۆ ئەوەی گومانیشی لێ نەکەن وتی: من بە پارە و بە کرێ شیر بەم منداڵە دەدەم!..

دایکی موسا، موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی لە باوەش گرت.. موسا(سڵاوی خوای لێبێت) مەمکی دایکی مژی و تێر شیری خوارد..

خاتوو ئاسیە ئۆخژنی هات و دڵخۆش بوو..

خاتوو ئاسیە بە دایکی موسای گوت: من تۆ بەکرێ دەگرم و پارەت پێ دەدەم، بۆ ئەوەی شیر بەم منداڵە بدەیت!..

دایکی موسا وای پیشاندا کە لەبەر پارە شیر بەو منداڵە دەدا.. بەوجۆرە خوای گەورە موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی گەڕاندەوە بۆ نێو ماڵ و باوەشی دایکی خۆی.. دایکی حەزرەتی موساش هێندەی تر بڕوا و متمانەی بە خوای گەورە پتەو بوو..

## لە نێو کۆشکدا

موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ماوەی شیرخواردنی تێپەڕاند و گەورە بوو.. گەڕایەوە بۆ نێو کۆشک.. لە ناو کۆشکدا گەورە بوو.. بوو بە لاوێکی بەهێز و خۆش ڕەفتار.. دڵی پڕبوو لە خۆشەویسی و بەزەیی بەرامبەر هەژاران و لێقەوماوان..

موسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە نێو کۆشکی فیرعەوندا بۆی دەرکەوت کە ئەو کوڕی فیرعەون نییە، بەڵکو ئەو ئیسرائیلییە و لەو گەلەیە کە فیرعەون هەموو کوڕە تازە لە دایک بووەکانی سەربڕیون!..



## ڕووبەڕووبوونەوەی ستەم

ڕۆژێک هاتە نێو شارەوە.. کات نیوەڕۆ بوو.. شار چۆڵ بوو.. خەڵکێکی وای تێدا نەبوو.. موسا(سڵاوی خوای لێبێت) پیاوێکی قیبتی بینی بە قامچی لە پیاوێکی بەنی ئیسرائیلی دەدات..

پیاوە بەنی ئیسرائیلیەکە هاواری دەکرد و داوای هاوکاری لە موسا(سڵاوی خوای لێبێت) کرد.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە بینینی ئەو دیمەنە زۆر توڕە بوو.. ڕۆیشتە پێشەوە و مستێکی توندی لە کابرای قیبتی دا.. کابرای قیبتی پار مرد نەک ئەمساڵ!..

جگە لە پیاوە بەنی ئیسرائیلییەکە نەبێ کەس نەیدەزانی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ئەو پیاوەی کوشتووە.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ش بە پەلە لەوێ دوورکەوتەوە..

بۆ ڕۆژی دوایی دیسان حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) هەمان پیاوەکەی دوێنێی بینیەوە کە لەگەڵ پیاوێکی تری قیبتیدا بەشەڕ هاتووە.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە پیاوە بەنی ئیسرائیلییەکەی وت: بەڕاستی تۆ پیاوێکی شەڕەنگێز و ئاژاوەچیت!.. وادیارە تۆ فێری و هەموو ڕۆژێک شەڕ دەکەی، نابێ وابیت!..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ویستی خۆی لە کابرای قیبتی توڕە بکات و لە ئەوی تری دوور بخاتەوە، بەڵام کابرای بەنی ئیسرائیلی وای گومان برد کە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەیەوێ ئەویش بکوژێ، بۆیە هاواری کرد و وتی: ﴿يا مُوسى أَ تُرِيدُ أَنْ تَقْتُلَنِي كَما قَتَلْتَ نَفْساً بِالأَمْسِ إِنْ تُرِيدُ إِلاّ أَنْ تَكُونَ جَبّاراً فِي الأَرْضِ وَ ما تُرِيدُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ﴾ القصص: ١٩ واتە: ئەی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەتەوێت منیش بکوژیت وەك ئەو کەسەی دوێنێ کوشتت، دیارە تۆ هەر دەتەوێت ببیتە زۆردار لە زەویدا، ناتەوێت بچیتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە چاکەکارن.

دوای ئەوەی خەڵک گوێیان لە قسەی ئەو پیاوە بوو، ئیتر ئاشکرا بوو کە کێ دوێنێ پیاوە قیبتییەکەی کوشتووە.. کتوپڕ شۆفارەکان ڕۆیشتن و فیرعەونیان ئاگادار کردەوە..

## پیلانگێڕی

فیرعەون لە گەڵ کاربەدەستەکانی کۆ بوویەوە و پێی وتن: موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بوو کە دوێنێ پیاوەکەی ئێمەی کوشتووە!.. دەبێ تۆڵەی لێ بکەینەوە و بیکوژین!..

لە نێو کۆشکی فیرعەوندا پیاوێکی باوەڕدار و پاک هەبوو.. لە وێ خزمەتکار بوو.. ئاگای لە قسەکانی فیرعەون بوو.. بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) و پێی گوت: ﴿يا مُوسى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النّاصِحِينَ﴾ القصص: ٢٠ واتە: ئەی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) (فریای خۆت بکەوە) بەڕاستی دارودەستەی فیرعەون دانیشتوون و نەخشە دەکێشن تا بتکوژن، تا زووە دەرچۆ و ئێرە بەجێ بهێڵە، بێگومان من لە دڵسۆزانم بۆ تۆ.

ئیتر حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بەترس و بیمەوە لە شار دەرچوو، هەر سەیری ئەملا و ئەولای خۆی دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەیوت: ﴿رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظّالِمِينَ﴾ القصص: ٢١ واتە: پەروەردگارا لە دەست قەومی ستەمکار ڕزگارم بکە.



حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕێگای سارا و دەشتی گرتە بەر و بەرەو مەدیەن هەڵات.. سێ ڕۆژی ڕەبەق ڕێی کرد.. ئەوەندە ڕێی کردبوو قاچەکان ئاوسان.. خواردنیشی بریتی بوو لە گژوگیای ئەو دەشت و سارایە..

## خاکی مەدیەن

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) گەیشتە خاکی مەدیەن.. لە ژێر سایەی دارێکدا پشووی دا.. دارەکە نزیک شیو و دۆڵ و کانیی و ئاوێک بوو.. تەماشا دەکا چەند شوانێک ڕانە مەڕەکانیان بە مەبەستی ئاودان بەرەو کانییەکە داوەتەبەر.. خوای گەورە باسی ئەم دیمەنە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَ لَمّا وَرَدَ ماءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِنَ النّاسِ يَسْقُونَ وَ وَجَدَ مِنْ دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودانِ قالَ ما خَطْبُكُما قالَتا لانَسْقِي حَتّى يُصْدِرَ الرِّعاءُ وَ أَبُونا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾ القصص: ٢٣ واتە: کاتێك گەیشتە ئاوەکەی مەدیەن، خەڵکێکی بینی ماڵاتەکانیان ئاودەدا، لەولاشەوە دوو ئافرەتی بینی بەخۆیان و مەڕەکانیانەوە دوورە پەرێز وەستا بوون، بۆیە لێیان چووە پێشەوە و پرسی: ئەوە ئێوە بۆچی لێرە وەستاون؟ کێشەتان چییە وا دوورە پەرێزن؟ ئافرەتەکان وتیان: ئێمە ناتوانین ماڵاتەکەمان ئاوبدەین، هەتا شوانەکان نەڕۆن و چۆڵی نەکەن، باوکیشمان پیرەمێردێکی بەساڵاچووە.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) دۆڵچەکەی لە شوانەکان وەرگرت و فڕێی دایە نێو بیرەکە و ئاوی هەڵگۆزی و ڕانە مەڕی دوو کچەکەی ئاودا.. شوانەکان هەموویان سەیری هێز و بازووی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)یان دەکرد و پێی سەرسام بوون..

دوو کچەکەش دڵیان بەو یارمەتییەی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) خۆش بوو..

ئەو پیرە پیاوە، کە باوکی ئەو دوو کچە بوو، پێغەمبەر (شوعەیب(سڵاوی خوای لێبێت)) بوو.. دوای ئەوەی کچەکان گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە و چیرۆکەکەیان بۆ باوکیان گێڕابووەوە، حەزرەتی شوعەیب یەکێکیانی نارد بە دوای حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)دا.. کچەکە زۆر بە شەرمەوە هات بۆ لای حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) و پێی گوت: ﴿إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ ما سَقَيْتَ لَنا﴾ القصص: ٢٥ واتە: بەڕاستی باوکم بانگت دەکات و دەیەوێ پاداشتی ئەوەت بداتەوە کە ماڵاتەکەت بۆ ئێمە ئاودا!..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕۆیشت بۆ ماڵی حەزرەتی شوعەیب(سڵاوی خوای لێبێت) و چیرۆکی خۆی بۆ حەزرەتی شوعەیب(سڵاوی خوای لێبێت) گێڕایەوە.. حەزرەتی شوعەیب(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿لاتَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظّالِمِينَ﴾ القصص: ٢٥ واتە: مەترسە تۆ ئیتر ڕزگارت بووە لە دەست ئەو ستەمکارانە.

دوایی یەکێک لە کچەکان بە باوکی وت: ﴿يا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ القصص: ٢٦ واتە: بابە بۆ بەکرێی ناگریت، چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بیگریت بە کرێ، ئەم پیاوە بەهێز و ئەمین و دەسپاك و دەروون پاکەیە.



حەزرەتی شوعەیب(سڵاوی خوای لێبێت) پێشنیازی کچەکەی پێ جوان بوو، بۆیە بە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی فەرموو: ﴿إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنْكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هاتَيْنِ عَلى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْراً فَمِنْ عِنْدِكَ وَ ما أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شاءَ اللَّه مِنَ الصّالِحِينَ﴾ القصص: ٢٧ واتە: من پێم چاکە بتکەم بە کوڕی خۆم، بە زاوای خۆم، یەکێك لەم دوو کچەت لێ مارە بکەم، بەمەرجی ئەوەی هەشت ساڵ لای من کار بکەیت، خۆ ئەگەر دە ساڵیشت بردە سەر ئەوە چاکەی خۆتە، منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم، ئەگەر خوا بیەوێت دەمبینیت لە چاکان دەبم.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بەو پێشنیازە ڕازی بوو، بۆیە فەرمووی: ﴿ذالِكَ بَيْنِي وَ بَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلا عُدْوانَ عَلَيَّ وَ اللَّه عَلى ما نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ القصص: ٢٨ واتە: ئەم پەیمانە لە نێوان من و تۆدایە، من پێی ڕازیم، بەڵام هەرکام لەو ماوانەم بۆ تەواوکرا با ستەمم لێ نەکرێت و ئازادبم، خوای گەورەش شایەت و ئاگایە بەوەی کە دەیڵێین و بڕیاری لەسەر دەدەین.

ئیتر حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) (صەفورا)ی کچی حەزرەتی شوعەیبی مارە کرد و بوو بە شوانی حەزرەتی شوعەیب(سڵاوی خوای لێبێت).. دوای ئەوەی ماوەی دیاریکراو تەواو بوو حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بڕیاری گەڕانەوەی بۆ میسر دا..

## بانگی ئاسمانی

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە خۆی و ماڵ و منداڵیەوە بەرەو میسر گەڕایەوە.. لە ڕێگادا لە دەشتی (سینا) ئێوارەیان بەسەر هات.. دونیا تاریک بوو.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕێگای لێ تێکچوو.. لە ناکاو حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە لای کێوی (تور)ەوە تیشکێکی بینی.. بۆیە بە ژنەکەی وت: ﴿امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ ناراً لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْها بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ القصص: ٢٩ واتە: ئێوە لێرە بن، من بەڕاستی تروسکایی ئاگرێك دەبینم بەڵکو بچم هەواڵێکتان بۆ بهێنمەوە، یان چڵۆسکێك ئاگرتان بۆ بهێنم تا خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بەرەو ئاگرەکە ڕۆیشت.. دارێکی بینی ئاگری گرتبوو.. لە پڕ گوێی لە دەنگێک بوو بانگی ئەوی دەکرد و دەیفەرموو: ﴿إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوادِ الْمُقَدَّسِ طُوىً * وَ أَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِما يُوحى﴾ طه: ١٢-١٣ واتە: دڵنیابە من پەروەردگاری تۆم، کەواتە پێڵاوەکانت دا بکەنە، چونکە بێگومان تۆ لە دۆڵی پیرۆزی (طوا) دایت... منیش هەڵم بژاردوویت (بۆ ڕابەرایەتی و پێغەمبەرایەتی) جا گوێ بگرە بۆ ئەو شتانەی لە ڕێگەی وەحی و نیگاوە پێت ڕادەگەیەنرێت.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ترسی لێ نیشت.. دیسان دەنگەکە هاتەوە و فەرمووی: ﴿يا مُوسى إِنِّي أَنَا اللَّه رَبُّ الْعالَمِينَ﴾ القصص: ٣٠ واتە: ئەی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)! بەڕاستی من زاتی (الله)م، پەروەردگاری هەموو جیهان..

پاشان فەرمووی: ﴿وَ أَنْ أَلْقِ عَصاكَ﴾ القصص: ٣١ واتە: گۆچانەکەت فڕێ بدە!..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) گۆچانەکەی فڕێدا.. ﴿فَلَمّا رَآها تَهْتَزُّ كَأَنَّها جَانٌّ وَلّى مُدْبِراً وَ لَمْ يُعَقِّبْ﴾ القصص: ٣١ واتە: جاکاتێک فڕێیدا بینی، وەکو تولەمار بەخێرایی دەجووڵا، موسا(سڵاوی خوای لێبێت) هەڵات و پشتی تێکرد و ئاوڕی نەدایەوە.

دیسان دەنگەکە هاتەوە و فەرمووی: ﴿يا مُوسى أَقْبِلْ وَ لاتَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الآمِنِينَ﴾ القصص: ٣١ واتە: ئەی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) مەترسە، چونکە بەڕاستی پێغەمبەران لە لای من ناترسن و بیمیان نییە.

دەنگەکە ئەوەیشی فەرموو: ﴿اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَ اضْمُمْ إِلَيْكَ جَناحَكَ مِنَ الرَّهْبِ فَذانِكَ بُرْهانانِ مِنْ رَبِّكَ إِلى فِرْعَوْنَ وَ مَلَائِهِ إِنَّهُمْ كانُوا قَوْماً فاسِقِينَ﴾ القصص: ٣٢ واتە: ئینجا دەستت بخەرە بن باخەڵتەوە، بەشێوەیەکی سپی (وەکو بلوور، دەستت خۆی دەنوێنێت) بێگەرد و بێ پەڵە و بێ عەیب، هەروەها بازووەکانت بهێنەرەوەیەك و لەسەر سینە و دڵتی دابنێ، ترس و بیمت نامێنێت، ئەم دوو (معجزە) یە دوو باڵگەن لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ سەر فیرعەون و دارودەستەی، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی یاخی و نالەبار و تاوانبار بوون.

دوایی دەنگەکە پێی فەرموو: ﴿اذْهَبْ إِلى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغى﴾ طه: ٢٤ واتە: دە بچۆ بۆ لای فیرعەون، چونکە بێگومان یاخییە و لە سنوور دەرچووە.

بەوجۆرە خوای گەورە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی هەڵبژارد و کردی بە پێغەمبەری خۆی.. دەبوو بڕوا بۆ لای فیرعەون و بانگی بکات بۆ یەکتاپەرستی و وازهێنان لە ستەم و نالەباری..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) داوای لە خوای گەورە کرد و فەرمووی: ﴿وَ اجْعَلْ لِي وَزِيراً مِنْ أَهْلِي * هارُونُ أَخِي * اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي * وَ أَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي * كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيراً * وَ نَذْكُرَكَ كَثِيراً * إِنَّكَ كُنْتَ بِنا بَصِيراً﴾ طه: ٢٩ ـ ٣٥ واتە: لەکەس و کاریشم هاوکار و یارمەتیدەرێکم بۆ بڕیاربدە... (حەز دەکەم) هاروونی برام بێت... خوایە پشتمی پێ بەهێز بکە... بیکە هاوبەش و یاریدەدەرم، لە گەیاندنی (پەیامەکەتدا)... تا تەسبیحات و ستایشی تۆ زۆر بکەین... زۆر یادی تۆش بکەین و ناوی تۆ بەرین... چونکە بەڕاستی تۆ هەمیشە بینای بە حاڵی ئێمە، بە هەڵس و کەوتی ئێمە، بە هەموو شتێکی ئێمە.

خوای گەورە نزا و پاڕانەوەکانی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی گیرا کرد و فەرمووی: ﴿قالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يا مُوسى﴾ طه: ٣٦ واتە: ئەی موسا هەموو داخوازییەکانت بەجێ و پەسەندن و هەموویانت پێدران.

دوایی فەرمووی: ﴿سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَ نَجْعَلُ لَكُما سُلْطاناً فَلايَصِلُونَ إِلَيْكُما بِآياتِنا أَنْتُما وَ مَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغالِبُونَ﴾ القصص: ٣٥ واتە: ئێمە پشت و بازووی تۆ بەهێز دەکەین بەهۆی براکەتەوە و دەسەڵاتێکتان پێ دەبەخشین کە نەتوانن بێنە سەرتان، جا بەهۆی موعجیزەکانمانەوە هەردووکتان و هەموو شوێنکەوتووانتان سەرکەوتوو و زاڵن.

## له نێو کۆشکی فیرعەوندا

خوای گەورە فەرمانی بە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) کرد و فەرمووی: ﴿اذْهَبا إِلى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغى * فَقُولا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشى﴾ طه: ٤٣ـ٤٤ واتە: هەردووکتان بچن بۆ لای فیرعەون، چونکە بەڕاستی ئەو لە سنوور دەرچووە و لە مەرزی بەندایەتی ترازاوە.. هەردووکتان بەنەرمی و جوانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرێت، یان ترسی (سزای ئێمە) لە دەروونیدا جێ بگرێت.

حەزرەتی موسا و حەزرەتی هارون(سڵاوی خوایان لێبێت) پێکەوە ڕۆیشتن بۆ کۆشکی فیرعەون.. فیرعەون لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتبوو.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە شێوازی پێغەمبەران سڵاوی لە فیرعەون کرد..

فیرعەون وتی: ئێ موسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە کۆتاییدا هاتیەوە؟!.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: بەڵێ! بەڕاستی هەواڵی زۆرم پێیە بۆت.

فیرعەون وتی: مەبەستت چییە؟..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: خوای گەورە منی کردووە بە پێغەمبەر و ناردوومی بۆ لای تۆ!..

فیرعەون وتی: خوا؟! ﴿وَ ما رَبُّ الْعالَمِينَ﴾ الشعراء: ٢٣ واتە: بۆ پەروەردگاری هەموو دونیا کێیە؟!! ..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: خوای پەروەردگاری هەموو دونیا.. ﴿رَبُّ السَّماواتِ وَ الأَرْضِ وَ ما بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ مُوقِنِينَ﴾ الشعراء: ٢٤ واتە: ئەو پەروەردگارە، بەدیهێنەری هەموو ئاسمانەکان و زەویە و هەرچیش وا لە نێوانیاندایە، ئەگەر ئێوە بڕوا دەکەن و دڵنیا دەبن.

فیرعەون وەک گاڵتەکردنێک بە قسەکانی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) و باوەڕنەکردن پێی، سەیرێکی پیاوانی دەوروبەری خۆی کرد!..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿رَبُّكُمْ وَ رَبُّ آبائِكُمُ الأَوَّلِينَ﴾ الشعراء: ٢٦ واتە: پەروەردگاری من پەروەردگاری ئێوەش و پەروەردگاری باب و باپیرانی دێرینیشتانە.

فیرعەون بە پیاوەکانی دەوروبەری خۆی وت: ﴿إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾ الشعراء: ٢٧ واتە: بە ڕاستی ئەو پێغەمبەرەی بۆ ئێوە ڕەوانە کراوە شێتە!!.

دواتر فیرعەون بە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی وت: ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينا وَلِيداً وَ لَبِثْتَ فِينا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ * وَ فَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَ أَنْتَ مِنَ الْكافِرِينَ﴾ الشعراء: ١٨ـ١٩ واتە: (ئەمە پاداشتی پیاوەتییە؟) ئایا ئێمە بە منداڵی بە خێومان نەکردیت؟ چەندەها ساڵی تەمەنت لەناوماندا نەبردەسەر؟... ئەوەشت کرد کە کردت (مەبەست کوشتنی قیبتیەکەیە) دیارە کە تۆ لە ڕیزی ئەو کەسانەدایت کە ناشکورن و پاداشتی پیاوەتی نازانن!.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: من نەمدەزانی ئەو پیاوە بەو مستەی من دەمرێ.. تۆش ماوەیەکی زۆر منداڵانی بەنی ئیسرائیلت سەربڕی!.. پیاوان و ژنانیشیانت کردووە بە کۆیلەی خۆت!.. ئێستا خوای گەورە منی هەڵبژاردووە و کردوومی بە پێغەمبەری خۆی.. ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنا بَنِي إِسْرائِيلَ وَ لا تُعَذِّبْهُمْ﴾ طه: ٤٧ واتە: نەوەکانی ئیسرائیل ئازاد بکە، با لە گەڵماندا بن، سزا و ئازاریان مەدە.

فیرعەون وتی: تۆ پیاوێکی درۆزنی!.. من خوای هەرە گەورەم!..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ئەی ئەگەر بەڵگە بۆ پێغەمبەرایەتی خۆم بێنمەوە چی؟..

فیرعەون بە فشە و گاڵتە و لە خۆبایی بوونێکەوە وتی: ئادەی با بزانم بەڵگەت چییە؟..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) گۆچانەکەی فڕێدایە سەر زەوی، گۆچانەکەی بوو بە مارێکی زەبەلاح!..



## دۆڕانی جادووگەرەکان

فیرعەون بە ناو خەڵکدا دەنگۆی ئەوەی بڵاو کردەوە کە موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بووە بە جادووگەر!.. بۆیە لە هەموو لایەکەوە پەنای بۆ جادووگەرە بەناوبانگەکان برد بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن و حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ببەزێنن!..

فیرعەون وتی: ﴿أَ جِئْتَنا لِتُخْرِجَنا مِنْ أَرْضِنا بِسِحْرِكَ يا مُوسى * فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِثْلِهِ فَاجْعَلْ بَيْنَنا وَ بَيْنَكَ مَوْعِداً لانُخْلِفُهُ نَحْنُ وَ لا أَنْتَ مَكاناً سُوىً﴾ طه: ٥٧ـ٥٨ واتە: ئەی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) هاتووی بۆ لامان، تا بەهۆی جادووگەرییەکەتەوە لەسەر زەوی خۆمان بە دەرکردنمان بدەیت و ئاوارەمان بکەیت؟!.. کەواتە سوێند بێت ئێمەش جادوویەکت بۆ دەهێنین وەک ئەوەی خۆت، جا شوێن و کاتێک بۆ ئێمەو بۆ خۆت دابنێ، نە ئێمە سەرپێچی لێ بکەین نە تۆش، تا لە یەک شوێن و کاتدا دەستبەکار ببین لە شوێنێکی ڕێکوپێکدا.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿قالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَ أَنْ يُحْشَرَ النّاسُ ضُحىً﴾ طه: ٥٩ واتە: کاتی دیاریکراومان ڕۆژی ڕازاندنەوە بێت، لەکاتی چێشتەنگاودا خەڵکی کۆبکرێتەوە (بۆ ئەوەی خەڵکی میسر هەموویان ئامادە بین و خۆیان بە چاوی خۆیان دیمەنەکان ببینن).

فیرعەون هەموو جادووگەرە بەناوبانگەکانی لە میسری کۆ کردەوە، جادووگەرەکان وتیان: ﴿أَ إِنَّ لَنا لَأَجْراً إِنْ كُنّا نَحْنُ الْغالِبِينَ﴾ الشعراء: ٤١ واتە: ئەگەر ئێمە سەرکەوتین و بردمانەوە، ئایا پاداشتمان دەبێ؟!..

فیرعەون پێی وتن: ﴿نَعَمْ وَ إِنَّكُمْ إِذاً لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ الشعراء: ٤٢ واتە: بەڵێ بێگومان ئێوە لەو کاتەدا لە نزیکانی من دەبن.

سەرەڕای ئەوە فیرعەون بەڵێنی ئەوەیشی پێدان کە پڕ بەماڵەکانیان زێڕ و زیو و پارەیان پێ ببەخشێت.. ڕۆژی دیاریکراو هاتە پێشەوە..

جادووگەرەکان هەموو هاتنە نێو گۆڕەپانە گەورەکەی شارەوە.. دوایی ﴿فَأَلْقَوْا حِبالَهُمْ وَ عِصِيَّهُمْ وَ قالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنّا لَنَحْنُ الْغالِبُونَ﴾ الشعراء: ٤٤ واتە: هەرچی پەت و گوریس و دار و گۆچانیان هەیە فڕێیاندا و وتیان: بە یارمەتی و دەسەڵاتی فیرعەون، بێگومان هەر ئێمە سەردەکەوین و هەر ئێمە دەیبەینەوە.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ش گۆچانەکەی بە دەستەوە بوو، هاتە نێو گۆڕەپانەکەوە..

جادووگەرەکان وتیان: ﴿يا مُوسى إِمّا أَنْ تُلْقِيَ وَ إِمّا أَنْ نَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقى﴾ طه: ٦٥ واتە: ئەی موسا؛ یان تۆ دەستبەکاربە و (دار عەسای خۆت) فڕێ بدە، یان ئێمە سەرەتا دەست پێ دەکەین و فڕێی دەدەین؟.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿بَلْ أَلْقُوا فَإِذا حِبالُهُمْ وَ عِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّها تَسْعى﴾ طه: ٦٦ واتە: نەخێر؛ ئێوە لە پێشدا دەست پێ بکەن.. جا هەر دەستیان پێکرد پەت و گوریس و دار و چێوەکانیان ، وا دەهێنرایە بەرچاو (دەتگوت) بێگومان وەک مار بەخێرایی دەڕۆن.

خوای گەورە نیگای بۆ حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) نارد و پێی فەرموو: ﴿قُلْنا لاتَخَفْ إِنَّكَ أَنْتَ الْأَعْلى * وَ أَلْقِ ما فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ ما صَنَعُوا إِنَّما صَنَعُوا كَيْدُ ساحِرٍ وَ لايُفْلِحُ السّاحِرُ حَيْثُ أَتى﴾ طه: ٦٨ـ٦٩ واتە: (ئێمەش نیگامان بۆ کرد) وتمان: مەترسە و دڵنیابە چونکە بەڕاستی هەر تۆ بەرز و سەرکەوتوویت... ئەوەش لە دەستی ڕاستتدایە (واتە گۆچانەکەت) فڕێی بدە، هەرچی ئەوان

کردوویانە دەیماشیێتەوە و قووتی دەدات، چونکە بێگومان ئەوەی کردوویانە تەنها فێڵ و تەڵەکەی جادووگەرە، جادووگەریش بۆ هەر کوێ بچێت و هەرچی بکات سەرکەتوو نابێت.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) گۆچانەکەی فڕێدایە سەر زەوی.. گۆچانەکە بوو بە مارێکی گەورە.. هەموو دار و گوریس و چێوەکانی ئەوانی ماشییەوە و قوتی دان.. جادووگەرەکان هەموویان زانییان کە ئەم کارەی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) جادوو نییە و دوورە لە چاوبەست و خەڵەتاندن.. بۆیە هەموویان بڕوایان بە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) هێنا و سەجدەیان بۆ خوای گەورە برد و هاتنە ڕیزی باوەڕدارانەوە.. هەمووان بە دەنگی بەرز گوتیان: ﴿آمَنَّا بِرَبِّ هارُونَ وَ مُوسى﴾ طه: ٧٠ واتە: ئێمە بڕوامان هێنا بە خوای هارون و موسا (سڵاوی خوایان لێبێت).

دڵی فیرعەون پڕ بوو لە ڕق و کینە.. چونکە دۆڕانی جادووگەرەکان و پاشان بڕواهێنانیان، واتە ڕووخان و دۆڕانی فیرعەونێک کە خۆی بە خوا دەزانی.. بۆیە فیرعەون خۆی پێ نەگیرا و قیراندی و دەستیکرد بە گەف و هەڕەشە کردن و وتی: ﴿آمَنْتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُم السِّحرَ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُم وَ أَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلافٍ وَ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ وَ لَتَعْلَمُنَّ أَيُّنا أَشَدُّ عَذاباً وَ أَبْقى﴾ طه: ٧١ واتە: ئایا ئێوە هەر ئاوا باوەڕتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم و ڕازی بم؟ بەڕاستی دیارە موسا(سڵاوی خوای لێبێت) گەورە و مامۆستاتانە و هەر ئەو فێری جادووگەری کردوون، شەرت بێت دەست و قاچتان بە پێچەوانەوە بقرتێنم و هەڵتانواسم بە قەدی دارخورمادا، ئەوسا چاک دەزانن کە کامان (من، یان خوای موسا(سڵاوی خوای لێبێت)) سزامان توندوتیژ و بەردەوامە!.



جادووگەرەکان لە ناخی دڵەوە بڕوایان بە خوای مەزن هێنابوو.. بۆیە هەڕەشە و گوڕەشەی فیرعەون هیچیانی نەترساند و پاشگەز نەبوونەوە و وتیان: ﴿لَنْ نُؤْثِرَكَ عَلى ما جاءَنا مِنَ الْبَيِّناتِ وَ الَّذِي فَطَرَنا فَاقْضِ ما أَنْتَ قاضٍ إِنَّما تَقْضِي هذِهِ الْحَياةَ الدُّنْيا * إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنا لِيَغْفِرَ لَنا خَطايانا وَ ما أَكْرَهْتَنا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ وَ اللّهُ خَيْرٌ وَ أَبْقى﴾ طه: ٧٢ – ٧٣ واتە: هەرگیز تازە باوی تۆ نادەین بەسەر ئەم بەڵگە و نیشانانەدا کە بۆمان هاتووە، سوێند بەو کەسەی کە دروستی کردووین، چیت لەدەست دێت ئەنجامی بدە و درێغی مەکە، بەڕاستی تۆ هەر دەتوانیت ژیانی ئەم دنیایەمان لێ زەوت بکەیت... ئێمە ئیتر بەڕاستی باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگارمان، تا لە گوناهەکانمان خۆش ببێت و لەو جادووگەرییەش کە بە زۆر پێت کردین، هەمیشە خوای گەورە لە هەموو کەس چاکترە و لە هەموو کەس پایەدارتر و بەردەوامترە.

بەوجۆرە جادووگەرەکان لە جادووگەری پەشیمان بوونەوە و بڕوایان بە خوای تاک و تەنیا و پێغەمبەرێتی حەزرەتی موسا و حەزرەتی هارون(سڵاوی خوایان لێبێت) هێنا و لە بەرچاوی خەڵکی میسریش ڕایانگەیاند و وتیان: ئەوەی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەیکات جادوو نییە، بەڵکو موسا(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەرە و کارەکەیشی موعجیزە و پەرجووە..

## بیروباوەڕ

خاتوو ئاسیەی ژنی فیرعەون، بڕوای بە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) هێنا.. فیرعەون پێی زانی.. فیرعەون دەستیکرد بە سزادانی خاتوو ئاسیە.. ئەوەندە سزا و ئازاری دا تا خاتوو ئاسیە لە ژێر سزای فیرعەوندا گیانە پاکەکەی دەرچوو و بەرەولای پەروەردگار گەڕایەوە..

پێش ئەوەی دونیا بەجێبهێڵێ لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی: ﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ وَ نَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَ عَمَلِهِ وَ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظّالِمِينَ﴾ التحريم: ١١ واتە: پەروەردگارا لەلای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دروست بکە و لە دەست فیرعەون و کاروکردەوەی ڕزگارم بکە و لەدەست ئەم قەومە ستەمکارەش دەربازم بکە.

هەر لە ناو خزم و کەسوکاری فیرعەوندا پیاوێک بە ناوی (حەزقیل) بڕوای بە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) هێنابوو، بەڵام لە فیرعەون و داروودەستەی فیرعەونی شاردبوویەوە.. لە نێو کۆشکدا بە هەموو جۆرێ داکۆکی لە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەکرد..

فیرعەون لە سزادانی بەنی ئیسرائیل بەردەوام بوو.. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سزاکانی قورستر و زیاتر دەکرد.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت)ش بەردەوام ئامۆژگاری بەنی ئیسرائیلی دەکرد و دەیفەرموو: ﴿اسْتَعِينُوا بِاللّهِ وَ اصْبِرُوا إِنَّ الْأَرْضَ لِلّهِ يُورِثُها مَنْ يَشاءُ مِنْ عِبادِهِ وَ الْعاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ الأعراف: ١٢٨ واتە: داوای کۆمەکی و پشتیوانی لە خوا بکەن و دان بەخۆتاندا بگرن و ئارامگر بن، بەڕاستی زەوی موڵکی خوایە و دەیسپێرێت بە هەرکەس کە بیەوێت لە بەندەکانی، سەرئەنجامیش هەر بۆ پارێزکارانە.

## ڕۆژی ڕزگاربوون

فیرعەون لە نێو ئاپۆرای خەڵکدا بە بێ پێچ و پەنا ڕایگەیاند و وتی: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ النازعات: ٢٤ واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرز و بڵندی ئێوەم!..

دوای ئەوە بڕیاری کۆمەڵکوژکردنی بەنی ئیسرائیلی دەرکرد..

بۆیە حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە گەلەکەی ڕاگەیاند و فەرمووی: شەو بە نهێنییەوە ئێرە بەجێدێڵین و دەڕۆین!..

لە نیوەی شەوا هەموو بەنی ئیسرائیلییەکان بە ئاراستەی خۆرهەڵات وەڕێ کەوتن بەرەو سارای سینا.. حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) خۆی بوو بە ڕێنیشاندەر و پێشیان کەوت..

شۆفارەکان فیرعەونیان ئاگادار کردەوە و وتیان: ئیسرائیلییەکان هەموویان هەڵاتن!..

فیرعەون فەرمانی دەرکرد بۆ ئەوەی سوپایەکی گەورە و بەهێز دەربچێ و لەو دەشت و دەرەدا بەنی ئیسرائیلییەکان کۆمەڵکوژ بکەن..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) و گەلەکەی گەیشتنە کەناری دەریای سوور.. تەپوتۆزی سوپاکەی فیرعەونیش کە لە دوورەوە دەهاتن دەرکەوت.. ترس و بیم باڵی بەسەر بەنی ئیسرائیلییەکاندا کێشا..

ئا لەو کاتەدا خوای گەورە نیگا و سرووشی بۆ حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) نارد و فەرمووی: ﴿أَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ﴾ الشعراء: ٦٣ واتە: بە گۆچانەکەت بماڵە بە دەریاکەدا..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕۆیشتە پێشەوە و لە کەنار بەردێکی گەورەدا کە بنەکەی پڕبوو لە ئاو، ڕاوەستا.. خۆی داچەماندەوە و گۆچانەکەی ماڵی بە دەریاکەدا..

شتێکی زۆر سەرسوڕهێن ڕەویدا.. ﴿فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ الشعراء: ٦٣ واتە: (هەر کە ئەو کارەی کرد) دەریا شەق بوو و هەر ڕێگە و شەقامێکی دەورە درا بە شەپۆلی گەورەی ئاو، کە وەک کێوی گەورە و مەزن وابوو.

بەڵێ خوای گەورە دەسەڵاتی خۆی پیشانی هەمووان دا.. خەڵکەکە ترس و بیمیان ڕەوییەوە و دەستیان کرد بە پەڕینەوە بۆ ئەوبەری دەریاکە..



## کۆتایی

فیرعەون و سوپاکەی گەیشتنە کەناری دەریاکە.. خۆیان بە چاوی خۆیان ئەو موعجیزە گەورەیان بینی.. بەڵام باوەڕیان بە گەورەیی و دەسەڵاتداریی خوای گەورە و ڕاستگۆیی حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) نەهێنا.. بەڵکو هێندەی تر ڕق و کینەی لە دڵدا کۆبوویەوە.. بە شەللاق لە ئەسپەکەی دا و بەرەو پێشەوە لێیخوڕی.. سوپاکەیشی هەموویان بە دوای ئەوا لێیانخوڕی..

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) و گەلەکەی گەیشتنە ئەوبەری دەریاکە.. لەوکاتەدا فیرعەون و سوپاکەی گەیشتبوونە ناوەڕاستی دەریاکە.. ئا لەو کاتەدا موعجیزەیەکی تر ڕوویدا.. دەریاکە یەکی گرتەوە.. فیرعەون و سوپاکەی فیرعەون هەر هەموویان بوون بە ژێر ئاوی دەریاکەوە.. هەموویان خنکان و تیاچوون و بە سزای خوای گەورە گەیشتن.. کاتێ فیرعەون خەریک بوو دەخنکا لە ترسا بە پەلە وتی: ﴿آمَنْتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُوا إِسْرائيلَ وَ أَنَا مِنَ الْمُسْلِمينَ﴾ یونس: ٩٠ واتە: وا ئیتر باوەڕم هێنا بەوەی کە هیچ خوایەک نییە جگە لەو خوایەی کە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێناوە و من ئیتر لە موسڵمان و ملکەچانم.

بەڵام فیرعەون گوێی لە دەنگێک بوو وەڵامی دایەوەو وتی: ﴿آلْآنَ وَ قَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَ كُنْتَ مِنَ الْمُفْسِدينَ * فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَ إِنَّ كَثيراً مِنَ النَّاسِ عَنْ آياتِنا لَغافِلُونَ﴾ یونس: ٩١ـ٩٢ واتە: ئایا ئێستا، (باوەڕ دەهێنیت!) لەکاتێکدا بەڕاستی پێشتر یاخی بوویت و لە ڕیزی ئەوانەدا بوویت کە تۆوی خراپەیان دەچاند؟!.. ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزە و پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن (دیارە خوای گەورە پاڕاستویەتی لەوەی کە ماسی بیخوات، شەپۆلی دەریا گەیاندیە کەنار، تا ئەوانەی کە بەخوایان دەزانی بە چاوی خۆیان ببینن کە فیرعەون ئادەمیزادێکە وەک ئەو خەڵکە و ببێتە پەند، بۆ هەموو پادشا و زۆردارەکانی سەر زەوی کە ئەوە سەرئەنجامی مسۆگەری هەموویانە)، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵکی لە ئایەت و موعجیزەکانی ئێمە غافڵ و بێئاگان.

حەزرەتی موسا(سڵاوی خوای لێبێت) پێش گەلەکەی کەوت و هەموانی بەرەو سارای سینا برد.. خوا ئەوانی لە دەست ستەمی فیرعەون و سوپاکەی فیرعەون ڕزگار کرد و ژیانێکی نوێیان دەست پێکرد.

# چیرۆکی پێغەمبەران

6

قورئانی پیرۆز، ئەو کتێبەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم)، گرنگترین و ڕاستترین سەرچاوەی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە.. چونکە قورئان لە لایەن خوای گەورە و میهرەبانەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم)..

بۆیە دەبێ ئێمەش قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕامێنین و سوود لەو چیرۆکانە وەربگرین، بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین و ڕێگای پڕشنگداری پێ بدۆزینەوە..

ئەو ڕێگایەی کە بەرەو ئاشتی و ئەوین و خۆشەویستیمان دەبات.. بەرەو ئەو بیروباوەڕەمان دەبات کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە..

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە قورئانی پیرۆز و تەفسیرە بەنێوبانگەکانی قورئان وەرگیراون.. بۆ ئەوەی گرنگی بە بیروباوەڕی منداڵانمان بدەین..






ناوەندی ڕێنوێن


07701932749 - 07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)




9 789922 626659